یەکەمین هەنگاوەکانی

# بەکارهێنانی کۆمپیوتەر







لەگەڵ ئەم کتێبەدا سی دی یەکی پێویستیەکانی بەدیاری وەربگرە

ئامادەکار
ئیکرام هادی

تیوەندی Aram

# یەكەمین هەنگاوەكانی فێربوونی كۆمپیوتەر

ئامادەكردنی: إكرام هادی

# دابەزاندنی ویندۆزەكانی XP و ڤیستا

ئامادەكردنی : ئیكرام هادی

پرۆژەی ( ١٠٠ ) كتێبی بواری كۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت

زنجیرەی (١٤ )

سەرپەرشتیاری پرۆژەكە:ئارامی مەلا محەمەد

لــــــــەنێوەنـــــــدی ئـــــــــارامەوە بلاّودەكــــــــــــرێتەوە

لەگەڵ ئەم كتێبەدا یەك سیدی بەرنامەكانوپێویستییەكانی وەربگرە





ناوی كتێب : یەكەمین هەنگاوەكانی فێربوونی كۆمپیوتەر
نووسین و ئامادەكردنی: إكرام هادی
شوێنی چاپ : سلێمانی ٢٠٠٧-٢٠٠٨
نۆبەتی چاپ : چاپی یەكەم
شوینی بلاْوكردنەوە : نێوەندی ئارام
نرخی كتێب : تەنها پێنج هەزاردینارە
بۆدەست كەوتنی ئەمپەرتوكەپەیوەندی بكەبەنێوەندی ئارامەوە
ئاسیا ١٩١٨٥٦٥ سانا ١٢٤١٥١٨
كاری كۆمپیوتەر : ئامادەكار — نێوەندی ئارام

# یەکەمین هەنگاوەکانی فێربوونی کۆمپیوتەر

ئامادەکردنی: إكرام هادی







لێرەدا باسی چۆنێتی بەستنی وایەرەکان ناکەیت. چونکە لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر ئەگۆڕێت و ئەگەر بتوانیت تەلەفزیۆنێك ببەستیت ئەوا دوای چەند هەوڵێك ئەتوانیت کۆمپیوتەرەکەشت ببەستیت.

## داگیرساندنی کۆمپیوتەر

یەکەم هەنگاو بریتییە لە پەنجە نان بە دوگمەی داگیرساندن لەسەر کەیسی کۆمپیوتەرەکەت. شوێن و دیمەنی ئەم دوگمەیەش بەپێی کەیس دەگۆڕێت.



## داگیرساندنی مۆنیتەر

مۆنیتەری کۆمپیوتەرەکەت دوگمەی داگیرساندن/کوژاندنەوەی خۆی هەیە.

## بەکارهێنانی ماوس

دوای داگیرساندنی کومپیوتەر و مونیتەرەکەت، کاتی بەکارهێنانی ماوسە. ماوس بە گشتی دوو دوگمەی سەرەکی هەیە، کە پێیان دەوترێت دوگمەی کلیکی لای چەپ:



لەگەڵ دوگمەی کلیکی لای ڕاست:



سەرەڕای ئەم دوو دوگمەیە، سكرۆڵمان هەیە كە دەسوورێنرێتەوە و بەكاردێت بۆ هەندێ كاری تایبەت وەك تێپەڕبوون بەناو لاپەڕەكانی كتێبێكدا.



لە زۆربەی ماوسەكاندا ئەتوانیت پەنجە بە سكرۆڵدا بنێیت لەجیاتی سووڕاندنەوەی سكرۆڵ لە هەندێك شوێندا







**ماوسەكان لەم سەردەمەدا لیزەر** بەكاردێنن بۆ دیاریكردنی شوێنیان. لیزەرەكە **لە ژێر ماوسەكەدایە و كاتێك بەر ڕوویەكی گونجاو دەكەوێت** (وەك ڕووی مێزی كۆمپیوتەرەكە) و دەجوولێت. **ماوسەكە هەست بە جوولەكە دەكات و دەیگوێزێتەوە بۆ كۆمپیوتەرەكە**، كۆمپیوتەرەكەش جوولەكە بەكاردێنێت **بۆ جوولاندنی ئیشارەتی ماوسی سەر شاشەكە.**




# كلیك و دەبڵ كلیك

**كلیك واتە یەكجار پەنجەنان بە دوگمەی كلیكی لای چەپ یان لای ڕاست. كاتێك خوێندتەوە كە "كلیك لەسەر" شتێك بكەیت، ئەوا واتە پەنجە بە دوگمەی كلیكلی لای چەپدا بنێ. ئەگەر نووسەر مەبەستی كلیكی ڕاست بێت ئەوا پێت دەڵێت كلیكی ڕاست لەسەر شتەكە بكە.**

**دەبڵ كلیك واتە دووجار پەنجەنان، بە دوگمەی كلیكی لای چەپدا بە خێرایی.**

**شتێكیش هەیە پێی دەوترێت ترایپڵ** كلیك، واتە سێ جار كلیكی **لای چەپكردن بە خێرایی. ئەم ووشەیە لە كوردستاندا تا ئێستا نەماندیوە** بەكاربێت و زۆر كەسیش ئیشی پێ ناكات. **ترایپڵ كلیك لە هەندێ بەرنامەی تایبەتیدا كار دەكات وەك مایكرۆسۆفت** وۆرد. بۆ ئەوەی سەرت لێ تێك نەچێت، **بۆ ئێستا بیر لە ترایپڵ كلیك مەكەرەوە، ئیشت بە كلیكی تاك و** دەبڵ كلیك دەڕوات.





## باسێکی سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت

ئێستا باسیووشەیەکی نوێ دەکەین، ئەویش ووشەی "دێسکتۆپ" ە. دێسکتۆپ واتە شاشەی بنچینەیی کۆمپیوتەرەکەت کە دەردەکەوێت پاش داگیرسانی کۆمپیوتەرەکەت بە تەواوەتی.

ئەمە وێنەی دێسکتۆپە لە ویندۆزی XP میدیا سێنتەر.





## ئایكۆنەكان

ئایكۆن واتە وێنەیەك لە كۆمپیوتەردا كە ئامێرێك یان پرۆگرامێك دەربڕێت و بەهۆی كلیك كردن یان دەبڵ كلیك كردن لەسەری ئەو ئامێر یان پرۆگرامە بكاتەوە. بۆ نموونە ئایكۆنە سەرەتاییەكانی دێسكتۆپ بریتین لە:



بە دەبڵ كلیك كردن لەسەر ئایكۆنی My Computer (بە "مای كۆمپیوتەر" دەخوێنرێتەوە) شوێنێكت بۆ دەكرێتەوە كە لە ڕێیەوە ئەتوانیت كۆنترۆڵی ئامێرە جیاكانی كۆمپیوتەرەكەت بكەیت.



بە دەبڵ كلیك كردن لەسەر ئایكۆنی My Documents (مای دۆكیومێنتس) ئەو شوێنەت بۆ دەكرێتەوە كە نووسین و وێنە و مۆسیقای تێدا هەڵدەگریت.



بە دەبڵ كلیك كردن لەسەر ئایكۆنی Recycle Bin (ڕیسایكل بین)، سەتڵی خۆڵی كۆمپیوتەرەكەت بۆ دەكرێتەوە كە تیایدا ئەو بابەتانە هەڵدەگیرێن كە تۆ دەیان سڕیتەوە، بۆ ئەوەی بتوانیت دووبارە بیانگێڕیتەوە بۆسەر كۆمپیوتەرەكەت.

## ویندۆكان

پێشتر لە باسی ئایكۆنەكاندا ووتمان كاتێك دەبڵ كلیك لەسەر ئایكۆنێك دەكەیت شتێكت بۆ دەكرێتەوە. بەم شتە دەوترێت ویندۆ، واتە پەنجەرە. بۆ نموونە ویندۆی مای كۆمپیوتەر:







## تاسك بار

تاسك بار واتە شریتی كاركردن. شوێنی ئەم شریتە بە گشتی لە خوارەوەی دێسكتۆپدایە، بەڵام ئەتوانیت بیجووڵێنیت.



## بابەتەكانی سەر تاسك بار

### دوگمەی ستارت:




بە كلیك كردن لەسەر ئەم دوگمەیە لیستێكت بۆ دەكرێتەوە كە لە ڕێیانەوە ئەتوانیت چەندین كرداری جۆراوجۆر ئەنجام بدەیت.




•





## ئایكۆنەكانی كویك لۆنچ

بەشێكی تر لە بابەتەكانی سەر تاسكبارِ بریتین لە ئایكۆنەكانی كویك لۆنچ، كە رێگەت پێ ئەدەن بە یەك كلیك ئەو پرۆگرام یان بابەتانە بكەیتەوە كە پێویستت پێیانە.




## ویندۆ كراوەكان

هەر ویندۆیەك دەكەیتەوە ئەچێتە تاسكبارەوە، بۆ ئەوەی لە رێیانەوە بتوانیت بیانكەیتەوە و دایان بخەیت.



## ئایكۆنی زمان

ئەم ئایكۆنە (لای راستی وێنەكەی خوارەوە) پیشانت ئەدات چ زمانێك لە كۆمپیوتەرەكەدا بەكاردێت لە كاتێكی دیاری كراو. EN واتە ئینگلیزی و AR واتە عەرەبی. بە كلیك كردن لەسەر ئایكۆنەكە ئەتوانین زمانەكە بگۆڕیت.







## نایکۆنەکانی وەبیرخستنەوە

هەندێك پرۆگرام لێرەدا پیشان ئەدرێن کە بە گشتی لە پشتەوە کار دەکەن بە ئۆتۆماتیکی، واتە تۆ زۆر ئیشت پێیان نابێت بۆیە دەچنە ئەم سووچەوە.




## نایکۆنی ڕێکخستنی ئاستی دەنگ

بە کلیك کردن لەسەر ئەم ئایکۆنە ئەتوانیت ئاستی بەرز و نزمی دەنگ (ڤۆلیوم) ی سپیکەر یان هێدفۆنی کۆمپیوتەرەکەت زیاد یان کەم بکەیت.




## کاتژمێر

ئەمەش کاتژمێری کۆمپیوتەرەکەتە.




بەڵام تەنها کاتژمێر نییە، بە وەستاندنی ماوسەکەت لەسەری، بەروارەکەت پیشان دەدات.







## فایل

ـە کۆمپیوتەردا یەکەی هەڵگرتنی زانیاری برتییە لە فایل، بۆ نموونە فایلی وێنە برتییە لە وێنەیەك، فایلی نووسین نووسینە، و هتد.

هەر زانیارییەك کە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت هەیە لە شێوەی فایلدایە. وەك وێنە و دەنگ و مۆسیقا و ڤیدیۆ و دەق و خشتە و هتد. هەر یەکێکیش لەمانە چەندین فایلی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆ نموونە دەیان جۆر لە فایلی وێنە هەن، کە هەریەکێکیان تایبەتمەندێتی خۆی هەیە.

وێنەی چەند فایلێکی مۆسیقا، هەر یەکێك لە فایلەکان یەك گۆرانییە:




## فۆڵدەر

برتییە لە شوێنێك کە چەند فایلێکی تێدایە، هەر وەك جانتایەك وایە کە وێنە و نووسینەکانی تێدا بێت.

بۆ نموونە فایلەکانی سەرەوە هەموویان لەناو یەك فۆڵدەردان.

چەند فۆڵدەرێك:







## کردنەوەی فایل

بۆ کردنەوەی هەر جۆرە فایلێك چەندین ڕێگەت هەیە. لەوانە:

- دەبڵ کلیك بکە لەسەر فایلەکە.
- کلیکی ڕاست لەسەر فایلەکە بکە و پاشان کلیك لەسەر Open یان Play یان Preview بکە، ئەم ووشانە بەپێی فایلەکە دەگۆڕێن، بۆ نموونە ئەگەر نووسین بێت ئەوا Open ە (واتە کردنەوە)، بەلاّم ئەگەر مۆسیقا بێت ئەوا Play ە (واتە ئیش پێکردنی مۆسیقاکە)، ئەگەر وێنە بێت ئەوا Preview ە (واتە پیشاندانی وێنە).




- کلیك لەسەر فایلەکە بکە، پاشان پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ لەسەر کیبۆڕدەکەت.

## کردنەوەی فۆڵدەر

کردنەوەی فۆڵدەر وەك کردنەوەی فایل وایە.





## بابەتەكانی ناو My Computer

ویندۆی مای كۆمپیوتەر ڕێگەت پێ ئەدات تەماشای بابەتەكانی سەر كۆمپیوتەرەكەت بكەیت، وەك هاردیسكەكان و درایڤەكان. بۆ كردنەوەی هەر یەكێكیان دەبل كلیكی لەسەر بكە.







## کردنەوەی پرۆگرام

پرۆگرامە جیاوازەکانی ناو کۆمپیوتەر کردارە جیاوازەکان ڕادەپەڕێنن. بۆ نموونە بۆ نووسین پرۆگرامی وۆرد Word بەزۆری بەکاردێت، بۆ دەستکاریکردنی وێنە پرۆگرامی فۆتۆشۆپ Photoshop بەکاردێت، هتد. بۆ کردنەوەی هەر یەکێك لەم پرۆگرامانە چەند هەنگاوێك هەن کە لە خوارەوە باسمان کردوون:

١. کلیك لەسەر دوگمەی Start بکە.




٢. ئیشارەتی ماوسەکەت لەسەر All Programs بووەستێنە.

٣. ماوسەکەت لەسەر گرووپی ئەو پرۆگرامە بووەستێنە کە ئەتەوێت بیکەیتەوە. بۆ نموونە پرۆگرامی Microsoft Word لە گرووپی Microsoft Office دایە.







٤. کلیك لەسەر ئەو پرۆگرامە بکە کە ئەتەوێت.





## داخستنی پرۆگرام، گەورە و بچووک کردنی پرۆگرام

١ بۆ داخستنی هەر ویندۆیەك یان پرۆگرامێك، کلیك لەسەر ئایکۆنی ☒ بکە لە سووچی ڕاستی سەرەوەی ویندۆکەدا.





٢. بۆ ئەوەی ویندۆیەك پڕ بە شاشەکە بکەیت، کلیك لەسەر ئایکۆنی ▣ بکە.





٣. بۆ ئەوەی ویندۆکە بگەڕێنیتەوە بۆ باری ئاسایی، کلیك لەسەر ▣ بکە.






٤. بۆ بچووک کردنەوەی ویندۆیەک و ناردنی بۆ تاسکبار، کلیک لەسەر ▭ بکە.





- بۆ گەڕاندنەوەی ویندۆکە بۆ شوێنی خۆی، کلیك لەسەر ئایکۆنەکەی بکە لە تاسکبارِدا.




٦. ڕێگەیەکی دیکە بۆ بچووککردنەوەی ویندۆکە بۆ تاسکبار بریتییە لە کلیك کردن لەسەر ئایکۆنەکەی لە تاسکبارِدا کاتێك کە ویندۆکە کراوەتەوە.







## کۆپی، کەت، لەگەڵ پەیست

کۆپی واتە دروستکردنی هاوشێوەیەکی لە فایلێك، هەر وەك چۆن بە ئامێری استنساخ لاپەڕەیەك کۆپی دەکەیت، ئەتوانیت فایلێك کۆپی بکەیت بۆ دروستکردنی فایلی هاوشێوەی هەمان فایل.

کاتێك فایلێك کۆپی دەکەیت، فایلە نوێکە بە دەستتەوە دەبێت بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تردا دایبنێیت. بە پرۆسەی دانانی فایلە نوێکە دەوترێت پەیست.

کەت واتە لێکردنەوەی فایلێك. کاتێك فایلێك کەت دەکەیت ئەوا فایلەکە لە شوێنی خۆی هەڵدەگریت و دەیگریت بە دەستتەوە، پاشان بەهۆی پەیستەوە لە شوێنێکی تردا دای دەنێیت. کۆپی و کەت و پەیست بۆ فایل و فۆڵدەر بەکاردێن.

## کۆپی کردن

١. کلیکی ڕاست لەسەر فایل یان فۆڵدەرێك بکە.




٢ کلیك لەسەر Copy بکە.


٣. فۆڵدەرێکی دیکە بکەرەوە. بۆ نموونە کلیك لەسەر دوگمەی Back بکە بۆ گەڕانەوە بۆ فۆڵدەری پێشوو.








٤. کلیکی ڕاست لە شوێنێکی بەتاڵی فۆڵدەرەکەدا بکە.







• لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Paste بکە.

٦. فایلەکە لە فۆڵدەرەکەدا دادەنرێت.







## کەت کردن

١. کلیکی ڕاست لەسەر فایل یان فۆڵدەرێك بکە.





- لە لیستەكەدا كلیك لەسەر Cut بكە.




لێرە بەدواوە هەنگاوەكان هەر وەك كۆپیكردن وان.





## كوژاندنەوەی كۆمپیوتەر

كۆمپیوتەر وەك ئامێرێكی ئاسایی نییە كە هەر لە پلاكەكەوە بیكوژێنیتەوە. بەڵكو پێویستە لەناو كۆمپیوتەرەكەوە فەرمان دەربكەیت بۆ كوژانەوەی كۆمپیوتەرەكە. ئەگەر هەر لە پلاكەوە بیكوژێنیتەوە زیان بە كۆمپیوتەركەت دەگات و دەكرێت دوای چەند جارێك لەكار بكەوێت.

١. كلیك لەسەر دوگمەی Start بكە.




٢. كلیك لەسەر Turn Off Computer بكە.







٣ كلیك لەسەر Turn Off بكە.










## كوژاندنەوە و دووبارە داگیرساندنی كۆمپیوتەرەكەت

هەندێك جار پێویست دەكات كۆمپیوتەرەكەت بكوژێنیتەوە و دووبارە ڕاستەوخۆ دای بگیرسێنیتەوە. بۆ نموونە دوای دابەزاندنی پرۆگرامێك یان دروستبوونی كێشەیەك. بەم پرۆسەیە دەوترێت ڕیستارت.

١. كلیك لەسەر دوگمەی Start بكە.




٢. كلیك لەسەر Turn Off Computer بكە.



- كلیك لەسەر Restart بكە.










## خەو لێخستنی كۆمپیوتەرەكەت

هەندێك جار چەند پرۆگرامێكت كردووەتەوە، پاشان شتێك دێتە پێشەوە و پێویست دەكات كۆمپیوتەرەكەت بەجێ بێڵیت و بیكوژێنیتەوە، بەڵام ناتەوێت هەموو شتەكان دابخەیتەوە. لەم حاڵەتەدا ئەتوانیت كۆمپیوتەرەكەت خەو لێ بخەیت و پاشان دوای داگیرساندن هەموو پرۆگرامەكان لەشێوەی خۆیاندا دەردەكەونەوە. هەندێ كۆمپیوتەر ناتوانن ئەم پرۆسەیە ئەنجام بدەن.

١. كلیك لەسەر دوگمەی Start بكە.




٢. كلیك لەسەر Turn Off Computer بكە.







- پەنجە بە کلیلی Shift دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت.
- : کلیك لەسەر Hibernate بکە.










# ناساندنی کۆمپیوتەر

Heatsink and Fan
Memory
Power Supply
CPU
Vodeo Card
Dvd Burner
Motherboard
Hard Drive

# پارچەکانی کۆمپیوتەر








١. مۆنیتەر

٢. مەزەربۆرد (مەینبۆردیشی پێ دەوترێت)، خەریتەی ناوەوەی کۆمپیوتەرەکە.

٣. سی پی یو CPU، ئەو پارچەیەی کۆمپیوتەرە کە "بیرکردنەوە" ئەنجام ئەدات.

٤. رام.

٥. کارتەکان.

٦. پاوەر سەپلای.

٧. درایڤی CD و DVD.

٨. هارد دیسك.

٩. کیبۆرد.

١٠. ماوس.





## کەیس

کەیس ئەو سندوقەیە کە پارچە گرنگەکانی کۆمپیوتەرەکەی تێدایە. کەیس لە زۆر شێوەی جیاوازدا هەیە. پێویستە ئەوە بزانرێت کە کەیس کاریگەری لەسەر خێرایی و چاکیی کۆمپیوتەر نییە، تەنها سندوقێکە.



## مۆنیتەر

شاشەی کۆمپیوتەرە. دوو جۆری هەیە، مۆنیتەری CRT ئاسایی، کە لە تەلەفزیۆنێکی ئاسایی دەچێت:



لەگەڵ مۆنیتەر LCD:



## مەزەربۆرد

مەزەربۆرد دڵی کۆمپیوتەرەکەیە (لەناو کەیسدایە)، کە هەموو بەشەکانی کۆمپیوتەرەکە دەبەستێت بەیەکەوە.







## سی پی یو CPU

سی پی یو کردارە حسابییەکان ئەنجام دەدات. کرداری حسابیش تەنها لێکدان و کۆکردنەوە نییە، بەڵکو هەموو کردارێك کە تۆ لەسەر کۆمپیوتەرێك ئەنجامی ئەدەیت وەك کردنەوەی وێنەیەك، یان نووسینی ووشەیەك، بریتییە لە کردارێکی حسابی.




شوێنی سی پی یو لەسەر مەزەربۆردە لەناو کەیسدا، لەژێر پانکەیەکەوەیە کە بەردەوام فێنکی دەکاتەوە، چونکە سی پی یو گەرماییەکی زۆر دروست دەکات.





## هارددیسک

هارددیسک شوێنی خەزنکردنی زانیارییە. هەر بابەتێك کە تۆ دەیخەیتە ناو کۆمپیوتەرەکەتەوە، وەك وێنە، یان نووسین، یان مۆسیقا، هەمووی لەسەر هارددیسك دادەنرێت. هارددیسکیش لەناو کەیسدایە.







## رام RAM



رام بریتییە لە شوێنێك بۆ هەڵگرتنی زانیاری بە شێوەیەکی کاتیی. زۆر کەس هەن دوای چەند ساڵێك لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر لە بیرۆکەی رام تێنەگەیشتوون و سوودەکەی نازانن. بۆ ئەوەی تۆی ئازیز یەکێك نەبیت لەوانە، لێرەدا بەهۆی نموونەیەکەوە بابەتەکەت بۆ ڕوون دەکەینەوە. لە ژوورێکی کارکردندا، وەك لە نووسینگەیەك یان فەرمانگەیەك، فایلەکان دەخرێنە ناو فۆڵدەر (سجل) ی تایبەتەوە و لەسەر ڕەفە ڕیز دەکرێن (یان دەخرێنە ناو تورەکەوە وەك هەندێك شوێن). بۆ نموونە تۆ لەوێ کار دەکەیت، لە ڕۆژێکی دیاریکراودا تۆ تەنها ئیشت بە ١٠ فایلی دیاریکراوە، واتە بەردەوام ئیشت پێیان دەبێت، وەك زانیارییەکانی ناویان بەراورد بکەی، کە لەناو سجلی جیادان، ئەگەر تۆ یەك سجل دەرکەیت و فایلەکە بخوێنیتەوە، پاشان فایلەکە بخەیتەوە ناو سجلەکە و بیخەیتەوە شوێنی خۆی، پاشان سجلێکی دیکە دەرکەیت و فایلەکەی تر بخوێنیتەوە، پاشان بیخەیتەوە شوێنی خۆی. پاشان ئیشت بە فایلی یەکەم بوو دووبارە دەری بکەیتەوە، پاشان بیخەیتەوە شوێنی خۆی...هتد. ئەمە کات و ماندووبوونێکی زۆری دەوێت. لەجیاتی ئەمە تۆ هەموو فایلەکانی ناو سجلە جیاکان دەردەکەیت و لەسەر مێزەکە دایدەنێیت بۆ ئەوەی لەبەردەستدا بن و بە ئاسانی کاریان لەسەر بکەیت. بیرۆکەی رامیش وەك ئەم نموونەیە وایە. هارددیسك وەك ڕەفەکان وایە کە سجلیان تێدایە، رامیش وەك مێزەکە وایە. کاتێك لە کۆمپیوتەرەکەتدا کار لەسەر چەند فایلێکی دیاری کراو دەکەیت، ئەم فایلانە دەخرێنە ناو رامەوە بۆ ئەوەی بە خێرایی بتوانیت کاریان لەسەر بکەیت. خێرایی رام سەدان هەزار جار لە هارددیسك زیاترە.

کاتێك کۆمپیوتەرەکەت دەکوژێنیتەوە رام بەتاڵ دەبێتەوە، وەك چۆن کاتێك نووسینگەکە دادەخەیت بابەتەکانی سەر مێزەکە دەگەڕێنیتەوە بۆ شوێنی خۆیان.

شتێکی تریش پێویستە بیزانیت ئەوەیە کە تۆ لەکاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەردا پێویست ناکات بیرت لای رام بێت، رام لە پشتەوە کاردەکات و تۆ هەست بە بوونی ناکەیت.





## کارتەکان

کارتەکان توانای زیاتر دەبەخشن بە کۆمپیوتەرکەت، بۆ نموونە کارتی شاشە توانای پیشاندانی کۆمپیوتەرەکەت زیاد دەکات، کارتی سەتەلایت ڕێگەت پێ ئەدات کۆمپیوتەرەکەت ببەستیت لە ئامێرێکی سەتەلایت بۆ تەماشاکردنی کەناڵەکانی سەتەلایت، کارتی وایەرلێس ئینتەرنێتی وایەرلێس دەخاتە بەردەستی کۆمپیوتەرەکەت، هتد. ئەم کارتانە بەگشتی لەسەر مەزەربۆردی کۆمپیوتەرەکەت دادەنرێن.










## پاوەرسەپلای

ئیشی پاوەرسەپلای کۆمپیوتەر بریتییە لە گۆڕینی کارەباکانی AC ی ١١٠ و ٢٤٠ ڤۆڵت بۆ چەندین جۆری کارەبای DC ی بە ڤۆڵتییەی نزم بۆ بەشە جیاوازەکانی کۆمپیوتەرکە. پاوەرسەپلای بە گشتی پانکەیەکی تێدایە بۆ فێنککردنەوە.







## دارایڤی CD و DVD

وەك لە ناوەكەیانەوە دیارە، درایڤەكانی CD و DVD بابەتی سەر CD و DVD ئیش پێ دەكەن و دروست دەكەن.




جۆرێك درایڤ هەن پێیان دەوترێت ئێكستێرنال (External) واتە دەرەكی، كە لە دەرەوەی كۆمپیوتەرەكەوە دادەنرێت، وەك CD و DVD ی پلەیەری ئاسایی، بەڵام بە سیفاتی جیا.



## کیبۆرد

کیبۆرد یەکێکە لە ئامێرە سەرەکییەکانی فەرمانکردن بەسەر کۆمپیوتەرەکەدا. بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر لەگەڵ زیاد بوونی شارەزاییان لە کۆمپیوتەردا کیبۆرد زیاتر بەکاردێنن و واز لە ماوس دەهێنن.









## ماوس

ـمێرێکی دیکەی کۆنترۆڵکردنی کۆمپیوتەرەکەت بریتییە لە ماوس. لە بەشەکانی داهاتوودا چۆنێکی کارکردنی
ـس نحکەین.









## ێی چەپی کیبۆرد:




١. Space: سپەیس بەکاردێت بۆ دروستکردنی بۆشایی لە نێوان دوو ووشەدا.

٢. Alt: ئاڵت. لەگەڵ کلیلەکانی دیکەدا بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی کاری جیاواز.

٣. Windows: ویندۆز. ئەم کلیلە بەکاردێت بۆ کردنەوەی لیستی Start، هەروەها لەگەڵ کلیلەکانی تردا بەکاردێت بۆ ئەنجامدانی کرداری جیاواز.

٤. Control: کۆنترۆڵ. لەگەڵ کلیلەکانی تردا بۆ کاری جیاواز بەکاردێت.

٥. Shift: شیفت. لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ گۆڕینی نووسینی پیتەکان لە کەپیتاڵەوە بۆ سمۆڵ و بە پێچەوانەوە بەکاردێت. لە کوردیدا بۆ نووسینی هەندێك پیت بەکاردێت کە لەسەر کیبۆردەکە نەنووسراون. هەروەها لەگەڵ کلیلەکانی دیکەدا ئەتوانێت چەندین کاری جیاواز ئەنجام بدات.

٦. Caps Lock: کاپس لۆك. بەکاردێت بۆ داگیرساندن و کوژاندنەوەی فرمانی Caps Lock، کە لە سووچی سەرەوەی ڕاستی کیبۆردەکەدا گڵۆپێکی هەیە. ئەگەر داگیرسابێت لەکاتی نووسینی ئینگلیزیدا پیتەکان بە کەپیتاڵ دەنوسرێن، ئەگەر کوژابێتەوە بە سمۆڵ.

٧. Tab: تاب. لە کاتی نووسیندا بەکاردێت بۆ بازدان بۆ پێشەوە. لەگەڵ کلیلەکانی دیکەدا کاری جیاواز ئەنجام دەدات.

٨. Escape: ئیسکەیپ. بەکاردێت بۆ دەرچوون لە ویندۆکان و لە چەندین جۆری فرمان.

٩. Function Keys: کلیلەکانی فەنکشن. هەریەکێکیان کاری جیا لە پرۆگرامی جیادا ئەنجام ئەدات.





## ناوەڕاستی كیبۆرد




١. Enter: ئینتەر. بەكاردێت بۆ چوونە ناوەوەی پرۆگرام یان فرمانێك. لە كاتی نووسیندا بەكاردێت بۆ ڕۆشتن بۆ سەرەتای دێڕ.

٢. Control. هەمان كاری كۆنترۆڵی لاپەڕی پێشوو دەكات. چەند كلیلێكی دیكەش دووبارە دەبنەوە

٣. Application Key: كلیلی ئەپلیكەیشن. ئیشی كلیكی لای ڕاست ئەنجام ئەدات.

٤. Windows.

٥. Alt.

٦. Shift.

٧. Function Keys.





## ـی ڕاستی کیبۆرد




١. دوگمەی سەهمەکان. بۆ جوولە بەکاردێن لە چەندین شوێنی جیادا.

٢. Delete: دیلیت. بۆ سڕینەوە بەکاردێت.

٣. End: ڕۆشتن بۆ کۆتا... ...یڕ.

٤. Insert: دانانی بابەتێك کە کۆپی یان کەت کرابێت. لە شوێنی تایبەتیدا کار دەکات.

٥. Print Screen: پرنت سرکین. گرتنی وێنەی شاشەکە. پاشان ئەتوانیت وێنەکە لە پرۆگرامێکدا دابنێیت (پەیست بکەیت).

٦. Scroll Lock: دوگمەیەکە لە کیبۆردەکانی هەشتاکاندا زۆر بەکاردەهات، بەلأم ئێستا بەکارهێنانی زۆر کەم بووەتەوە. هەندێ کیبۆرد هەر ئەم کلیلەیان نییە. چەند پرۆگرامێك هەن کە کلیلەکە بەکاردێنن، وەك ئۆپێرا.

٧. Pause/Break: پۆز/برێك. لە کاتی یاریکردندا ئەم کلیلە یارییەکە دەوەستێنێت.

٨. Num Lock: نەم لۆك. شێوازی ئیشکردنی دوگمەکانی خوارەوەی خۆی دیاری دەکات. ئەگەر داگیرسابێت دوگمەکان ژمارە دەنووسن. ئەگەر کوژابێتەوە دوگمەکان کارێکی دیکە دەکەن.

٩. Enter. ئینتەر.





## نووسین به کوردی

چەند پیتێکی کوردی هەن کە لە زمانی عەرەبیدا نین و لەسەر کیبۆردەکە دیاری نەکراون. لێرەدا چۆنێتی نووسینی ئەم پیتانە باس دەکەین (پێویستە ئەوە بزانرێت کە کاتێك ئەتوانیت بە کوردی بنووسیت کە فۆنتێکی کوردی بەکاربێنیت):

گ: پەنجە بە کلیلی پیتی ط ی عەرەبیدا بنێ.




ڤ: پیتی ظ ی عەرەبی.




چ: پیتی ض ی عەرەبی.







ب- پیتی ث ی عەرەبی.




ت- پیتی ذ ی عەرەبی.




**حەوتی سەرەوە ٚ : شیفت و ض (واتە پەنجە لەسەر کلیلی شیفت دابنێ و بەبێ پەنجە هەڵگرتن پەنجە بە کلیلی ض دا بنێ).**







حەوتی ژێرەوە : شیفت و ش.



درێژكردنەوەی پیتەكان، بۆ نموونە: ســـــــــــروشـــــــــــت. لە ڕێگەی شیفت و ت دەكرێت. یەكەمجار پیتەكەت بنووسە، بۆ نموونە س لە نموونەكەی سەرەوەدا، پاشان شیفت و ت بكە بۆ درێژكردنەوەی پیتەكە.







## کردنەوەی پرۆگرامی ووردی ٢٠٠٣

ئەکرێت هەندێك لە هەنگاوەکان کەمێك جیاواز بن لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر.

١. کلیك لەسەر دوگمەی Start بکە.

1





- کلیك لەسەر All Programs بکە.





٣. ماوسەکەت لەسەر Microsoft Office بوەستێنە.

Chikka Messenger v.4
Download Accelerator Plus (DAP)
New Microsoft Office Document
New Office Document
Open Microsoft Office Document
Open Office Document
Windows Catalog
Windows Update
Yahoo! Messenger
Accessories
Advanced Task Manager
Azureus Vuze
Chikka Messenger v.4
C-Media 3D Audio
DivX
Download Accelerator Plus (DAP)
Easy Duplicate Finder
EverNote
Games
GlobalSCAPE
Google Desktop
Google Talk
Google Updater
IVT BlueSoleil
Kazaa Gold
Last.fm
Learning Essentials
MetaProducts Offline Explorer
MetaProducts Offline Explorer Pro
Microsoft Office
Microsoft Student
Mozilla Bon Echo

Mozilla Firefox
Nero
nLite
NoClone 2007 Home
Nokia PC Suite
Nokia Software Updater
Picasa2
QuickTime Alternative
Real
Recover My Files
Startup
Tradewinds 2
TuneUp Utilities 2007
Ulead MediaStudio Pro 8.0
VP6 VFW Codec
Windows Media Center
WinRAR
Xilokit
Yahoo! Messenger
Your Uninstaller! 2006
ZAR
Adobe ImageReady 7.0.1 ME
Adobe Photoshop 7.0.1 ME
Adobe Reader 8
Internet Explorer
MSN
Outlook Express
RealPlayer
Remote Assistance
TuneUp Utilities 2007
Windows Desktop Search
Windows Media Player
Windows Messenger

Office
Adobe Photoshop ME
Video Editor 8.0
Windows Media Playe
Microsoft Office Wor
Microsoft Office One 2007
Mozilla Firefox
Internet Explorer
Nero StartSmart
All Programs
start

3





٤. کلیك لەسەر Microsoft Office Word 2003 بکە.





## نووسین بە کوردی

سەرەتا پێویستە زمانی نووسینی کۆمپیوتەرەکەت بکەیت بە عەرەبی بە بەکارهێنانی Alt+Shift.
ئەگەر ڕاستەوخۆ دەست بکەیت بە نووسین ئەوا بە زمانی عەرەبی نووسینەکەت دەردەکەوێت، هەرچەندە تۆ مەبەستیشت نووسینی کوردی بێت. وەك نموونەکەی خوارەوە.

بۆ گۆڕینی نووسینەکە بە کوردی، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە.





١. سێ کلیکی یەك لە دوای یەك لەسەر ووشەیەکیان بکە بۆ دیاریکردنی هەموو دێڕەکە.





٢. كلیك لەسەر سەهمی تەنیشت ئەم بۆكسە بكە بۆ كردنەوەی لیستی فۆنتەكانی ناو كۆمپیوتەرەكەت. فۆنت واتە دیمەن و شێوازی نووسین. ئەگەر بتەوێت بە كوردی بنووسیت پێویستە فۆنتێكی كوردی بەكاربێنیت.





٣. کلیك لەسەر فۆنتێکی کوردی بکە. بۆ نموونە Ali _K_Jiddah. سکرۆڵی ماوسەکەت بەکاربێنە بو هاتوچۆکردن بەناو فۆنتەکاندا. ژمارەیەك فۆنت هەن پێیان دەوترێت فۆنتەکانی عەلی، ئەم فۆنتانە کوردی و عەرەبییان هەیە، بۆ جیاکردنەوەیان پیتی K لە ناوەڕاستی ناوی فۆنتەکەدا هەیە ئەگەر کوردی بێت، ئەگەر عەرەبی بێت پیتی A هەیە.





## گۆڕینی شوێنی نووسین

تۆ ئەتوانیت نووسینەکە بگوازیتەوە بۆ ناوەڕاست، یان لای چەپ، یان بیگەڕێنیتەوە بۆ لای ڕاست بە بەکارهێنانی هەنگاوەکانی خوارەوە:

١. کلیك لەسەر شوێنێك بکە لە ئەو بڕە نووسینەدا کە ئەتەوێت شوێنەکەی بگوازیتەوە.

1

Document1 - Microsoft Word

File Edit View Insert Format Tools Table Window Student Tools Help

برێك نووووووووسين

Page 1 Sec 1 1/1 At 3cm Ln 2 Col 18 REC TRK EXT OVR Arabic (Sau

٢ کلیك لەسەر دوگمەی Center بکە بۆ گواستنەوەی نووسینەکە بۆ ناوەڕاستی لاپەڕەکە.







- بۆ گواستنەوەی نووسینەکە بۆ لای چەپ کلیك لەسەر دوگمەی Align Left بکە.

٤. بۆ گەڕاندنەوەی نووسینەکە بۆ لای ڕاست کلیك لەسەر دوگمەی Align Right بکە.





## گۆڕینی قەبارەی نووسین

١. سەرەتا پێویستە ئەو نووسینە دیاری بکەیت کە ئەتەوێت قەبارەکەی بگۆڕیت. بۆ دیاریکردنی یەک ووشە، دوو کلیک لەسەر ووشەکە بکە، بۆ دیاریکردنی پاراگرافێك، سێ کلیک لەسەر یەکێك لە ووشەکانی ناو پاراگرافەکە بکە.





٢ کلیك لەسەر سەهمی تەنیشت قەبارەی نووسینەکە بکە بۆ کردنەوەی لیستی قەبارەکان





٣. کلیك لەسەر قەبارەیەکی نوێ بکە.





## ـولد. ئیتالیك، ئەندەرلاین

ـتوانیت نووسینی ئاسایی بگۆڕیت بۆ سێ جۆر دیمەنی سەرەكی، وەك نموونەكەی خوارەوە:

ـ سایی

**بۆلد**

*ـیتالیك*

<u>ـندەرلاین</u>

ـوسینی بۆلد ئەستوور و دیارترە، نووسینی ئیتالیك لارە، نووسینی ئەندەرلاین هێڵی بەژێرداهاتووە.

ـۆ گۆڕینی نووسینێكی ئاسایی بۆ یەكێك لەم سێ جۆرە، هەنگاوەكانی خوارەوە بەكاربێنە:

١. نووسینەكە دیاری بكە. بە دەبڵ كلیك لەسەر ووشەیەك (بۆ دیاریكردنی ووشەكە) یان سێ كلیك لەسەر ووشەیەك (بۆ دیاریكردنی هەموو پاراگرافەكە).







٢. کلیك لەسەر ئایکۆنی Bold بکە بۆ گۆڕینی نووسینەکە بە بۆڵد.

- بۆ ئیتالیك [illegible] ئایکۆنی Italic بکە.







٤. بۆ ئەندەرلاین کلیك لەسەر ئایکۆنی Underline بکە.





- بو لابردنی هەر یەکێک لە کاریگەرییەکان، دووبارە کلیك لەسەر ئایکۆنەکەی بکە.





## چوون بۆ سەرەتای دێڕ

دوای تەواوبوونی نووسینی هەر پاراگرافێك، پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ بۆ ڕۆشتن بۆ پاراگرافێکی نوێ.
هەروەها ئەگەر ویستت بڕێك نووسین ببەیت بۆ دێڕێکی نوێ، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە.

١. کلیك لەسەر سەرەتای ئەو شوێنە بکە کە ئەتەوێت ببێتە دێڕێکی نوێ.





٢. پەنجە بە كلیلی Enter دا بنێ لەسەر كیبۆردەكەت.

٣. ئەنجام:







## دانانی وێنە

١. كلیك لەسەر ئەو شوێنە بكە كە ئەتەوێت وێنەكەی تیا دابنێیت.





٢. لە لەسەر لیستی Insert بکە.





٣. ماوسەکەت لەسەر Picture بووەستێنە.





: كلیك لەسەر From File بكە.





٥. دایەلۆگ بۆکسی Insert Picture ت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا دەبێت وێنەیەك لەسەر كۆمپیوتەرەکەت دیاری بکەیت بۆ ئەوەی بیهێنیتەوە ناوەوە. بۆ نموونە ئەگەر وێنەکەت لە فۆڵدەری My Documents دا بوو (کە شوێنی هەڵگرتنی وێنە و مۆسیقایە)، کلیك لەسەر My Documents بکە.




٦. دەبڵ کلیك لەسەر My Pictures بکە.







٧. بابەتەکانی ناو فۆڵدەری My Pictures ت پیشان دەدرێت.




٨. بۆ بینینی وێنەکان لەجیاتی بینینی ئایکۆنەکانیان، کلیك لەسەر ئەم سەهمە بکە.







٩. کلیك لەسەر Thumbnails بکە.




١٠. ئێستا کلیك لەسەر یەکێك لە وێنەکان بکە.







١١. كلیك لەسەر Insert بكە. ئەتوانیت لەجیاتی هەنگاوەكانی (١٠) و (١١) دەبڵ كلیك لەسەر وێنەكە بكەیت.



١٢. وێنەکە دێتە ناوەوە.







## ڕێکخستنی لاپەڕەکە

ئەتوانیت بە ویستی خۆت ڕووبەری لاپەڕەکەت بگۆڕیت بۆ ئەوەی لەگەڵ خواستی تۆدا بگونجێت بە بەکارهێنانی ئەم هەنگاوانە:

١. کلیك لەسەر File بکە.





٢. کلیك لەسەر Page Setup بکە.





٣. كلیك لەسەر Margins بكە ئەگەر كلیكی لەسەر نەكراوە.

٤. لێرەدا ئەتوانیت دیاری بكەیت ئایا لاپەڕەكەت بە باری پانیدا بێت یان درێژی. كلیك لەسەر یەكێك لە دوو شێوازەكە بكە.







٥. كلیك لەسەر Paper بكە.

٦. كلیك لەسەر ئەم سەهمە بكە بۆ پیشاندانی كۆمەڵێك ڕووبەر بۆ ئەوەی بەكاری بێنیت بۆ لاپەڕەكانی فایلەكەت. بۆ نموونە A4 یان A3.

٧. كلیك لەسەر یەكێك لە ڕووبەرە دیاریكراوەكان بكە.



٨. ئەشتوانیت لێرەدا بە ویستی خۆت پانی و بەرزی لاپەڕەکانت بە سانتیمەتر دیاری بکەیت هەندێک کۆمپیوتەر بە ئینچ لاپەڕەکان دەپێون، ئەگەر ئەتەوێت سانتیمەتر بەکاربێنیت پێویستە دوای نووسینی ژمارەکە cm بنووسیت، بۆ نموونە 10cm واتە ١٠ سانتیمەتر (ئەشتوانیت کۆمپیوتەرەکە وا لێبکەیت کە سانتیمەتر بەکاربێنێت، کە لێرەدا ناتوانین باسی بکەین).

٩. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.





## خەزنکردنی فایلەکەت

پاش ئەوەی لاپەڕەکەت دروست کرد، کاتی ئەوە هاتووە کە لەناو کۆمپیوتەرەکدا خەزنی بکەیت. کاتێك کە سەرەتا بەرنامەی ووۆرد دەکەیتەوە، لاپەڕەیەکی نوێت لە بەردەستدا دەبێت، ئەم لاپەڕە نوێیە شوێنی لەسەر هارد دیسکی کۆمپیوتەرەکەت نییە، بەڵکو لە شوێنێکی تردایە پێی دەوترێت ڕام RAM ، ڕام تەنها کاتێك زانیاری تێدایە کە کارەبای تێدابێت. بە کوژاندنەوەی کۆمپیوتەرەکە ڕام بەتاڵ دەبێتەوە، وە بۆیە لاپەڕەکە لەناو دەچێت. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە لاپەڕەکە لەسەر هارد دیسکەکە دابنێیت. بە دانانی لاپەڕەکە لەسەر هارد دیسکەکە دەوترێت "سەیڤ"، ئەمەش بە ئینگلیزی واتە "پاراستن" یان "هەڵگرتن". مانایەکی جوانتر بۆی ووشەی "خزن" ی عەرەبییە.

**بۆ خەزن کردنی لاپەڕەکە:**

١. کلیك لەسەر File بکە.

1

Document1 - Microsoft Word

File Edit View Insert Format Tools Table Window Student Tools Help

New...
Open... Ctrl+O
Close
Save Ctrl+S
Save As...
Save as Web Page...
File Search...
Permission
Versions...
Web Page Preview
Page Setup...
Print Preview
Print... Ctrl+P
Send To
Properties
1 E:\SYS\Archive\2007\...\2007 وورد.doc
2 C:\...\Word 2003\Word 2003.doc
3 C:\...\Troubleshooting.doc
4 C:\Documents and Settings\...\Paint.doc
Exit

Page 1 Sec 1 1/1 At 5.3cm Ln 4 Col 25 REC TRK EXT OVR





٢ کلیك لەسەر Save بکە. دایەلۆگ بۆکسی Save As ت بۆ دەکرێتەوە.





٣. شوێنێك هەڵبژێرە بۆ خەزنكردنی فایلەكەت. بۆ نموونە كلیك لەسەر My Documents بكە بۆ خەزنكردنی فایلەكە لەناو فۆڵدەری My Documents دا.



٤. لێرەدا ناوێك بۆ فایلەكەت بنووسە. دواتر كە ویستت فایلەكەت بكەیتەوە ئەوا بەم ناوەدا دەیناسیتەوە.







٥. کلیك لەسەر Save بکە.



## خەزنکردن لەکاتی کارکردندا

دوای ئەوەی بۆ یەکەمجار فایلەکەت خەزن کرد، ئەگەر بەردەوام بیت لەسەر کاکردن لە فایلەکەدا و دانان و لابردنی بابەت تێیدا، پێویستت بەوە دەبێت دووبارە خەزنی بکەیتەوە. ئەگەر ئیشەکەت گرنگە پێویستە بە بەردەوامی خەزن بکەیت بۆ خۆ پاراستن لە فەوتانی زانیاری لەکاتی دروستبوونی کێشەدا. لەبەر ئەوەی کە شوێنێکت بۆ بابەتەکانت لە کۆمپیوتەرەکەتدا دروست کردووە بەهۆی خەزنکردنی فایلەکە بۆ یەکەمجار، ئێستا پێویست ناکات دووبارە شوێن بۆ فایلەکە دیاری بکەیت.

بۆ خەزنکردن:

١. کلیك لەسەر لیستی File بکە.

٢. کلیك لەسەر Save بکە. دەبینیت کە هیچ شتێك ناکرێتەوە، چونکە ڕاستەوخۆ بابەتەکە لە ئەو فایلەدا دادەنرێت کە پێشتر خەزنت کردووە.





٣. ئەشتوانیت لەجیاتی دوو هەنگاوەکەی پێشوو کلیك لەسەر ئایکۆنی Save بکەیت.





## نیشكردن بە مەلتیمیدیا لە Media Player دا

Media Player (میدیا پلەیەر) لێدانی مۆسیقا و ڤیدیۆكانت بۆ ئاسان ئەكات و چەندین هەڵبژاردنت ئەخاتە بەردەست. بنچینەی كاری ڕێكخستن لە میدیاپلەیەردا بریتییە لە "لیستی ئیشپێكردن" (playlist: پلەیلیست)، كە بریتییە لە هەڵبژاردنێك لە گۆرانی و ڤیدیۆكانت كە ئەتوانیت چۆنت بوێت ئاوایان ڕێك بخەیت. ئەشتوانیت بچیتە ناو مۆسیقاكانتەوە بە پشت بەستن بە سیفاتی مۆسیقاكە، وەكو هونەرمەند، ئەلبوم لەگەڵ جۆری مۆسیقا. ئەگەر ئەتەوێت فایلێكی دیاری كراو یان كۆمەڵێك فایلی دیاریكراو ئیش پێ بكەیت كە لە لیستێكی ئیشپێكردندا نەبن، ئەتوانیت ڕاستەوخۆ ئیشیان پێ بكەیت بەوەی كە بیانخەیتە ناو لیستێكی ئیشپێكردنی كاتییەوە بۆ ئەوەی عەزییەتی خۆت نەدەیت لەوەی كە بیانخەیتە ناو لیستێكی ئیش پێكردنی هەمیشەییەوە.

### ← دەستبكە بە نیش كردن

١. لە Media Player دا كلیك لەسەر تابی Library بكە.
٢. كلیك لەسەر دوگمەی Category بكە، پاشان سیفەتێكی جیاكەرەوە هەڵبژێرە.
٣. ئەو تایبەتمەندێتییە هەڵبژێرە كە ئەتەوێت بچیتە ناوی (بۆ نموونە ناوی ئەلبومەكان، یان ناوی هونەرمەندەكان). ئەگەر Navigation pane دیار نییە، كلیك لەسەر دوگمەی Layout Options بكە، پاشان لە لیستەكەدا Show Navigation Pane هەڵبژێرە.
٤. دەبڵ كلیك لەسەر ئەلبومێك بكە بۆ پیشاندانی گۆرانییەكانی ناوی ئەگەر خۆیان پیشان نەدرابوون.
٥. كلیك لەسەر ئەو فایلە بكە كە ئەتەوێت ئیشی پێ بكەیت.
٦. كۆنترۆڵەكان بەكاربێنە بۆ وەستاندنی فایلەكە و گەڕانەوە بۆ سەرەتا، خێراگەڕاندنەوە، وەستاندنی فایلەكە لە شوێنەكەی خۆیدا، خێرا تێپەڕاندن، لەگەڵ دەستكاریكردنی ئاستی بەرزی و نزمی دەنگەكە.

دوگمەی Layout Options

## گۆڕینی ڕیزبەندی نیشپێکردنەکە

١. کلیك لەسەر تابی Now Playing بکە ئەگەر خۆی هەڵنەبژێرراوە.

٢. بچۆ بۆ فایلێکی دیاری کراو لە List pane دا. دەبڵ کلیك لەسەر ناوی فایلەکە بکە لە لیستی ئیشپێکردنەکەدا. ئەگەر List pane دەرنەکەوتووە، ماوسەکە لەسەر Now Playing بووەستێنە. پاشان کلیك لەسەر سەهمە سەربەرەوخوارەکە بکە و لە لیستەکەدا Show List Pane هەڵبژێرە.

٣. بۆ گۆڕینی ڕیزبەندی فایلەکان لە لیستی نیشپێکردنەکەدا، کلیك لەسەر فایلێك بکە. پاشان ڕای بکێشە بۆ شوێنێکی تر.

٤. بۆ ئیشکردن بە فایلەکان بە شێوەیەکی تێکەڵ نە یەك لە دوای یەك. کلیك لەسەر دوگمەی Turn Shuffle On بکە. دووبارە کلیك لەسەر ئەم دوگمەیە بکە بۆ ئەوەی تێکەڵ کردنەکە نەمێنێت.





٥. بۆ ئیش كردن بە فایلەكانی ناو لیستی ئیشپێكردنەكە بەشێوەیەكی ناكۆتا (واتە ئەگەر یەك گۆرانی ئیش بكات، كاتێك تەواو ئەبێت بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی دەست پێ دەكاتەوە)، كلیك لەسەر دوگمەی Turn Repeat On بكە. بۆ كوژاندنەوەی ئەم فەرمانە دووبارە كلیكی لەسەر بكە.





## ڕێکخستنی لیستی ئیشپێکردنەکانت

کاتێك ژمارەیەکی زۆر فایلی دەنگ و ڕەنگت کۆکردووەتەوە، ئەکرێت کارێکی گران بێت کە ئاگات لە هەموویان بێت و بەڕێوەیان ببەیت. Media Player بەهاناتەوە دێت بەهۆی دوو ئامرازەوە کە ئەتوانن بێتاقەتییەکەت نەهێڵن: لیستی ئیشپێکردن کە یارمەتیت ئەدەن ئەو فایلانەی کە بەدڵتن پێکەوە ئیشیان پێ بکەیت، لەگەڵ لیستی ئیشپێکردنی ئۆتۆماتیکی، کە Media Player بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دروستیان ئەکات بەپێی ئەو یاسایەی کۆ تۆ بۆی دائەنێیت.

### دروستکردنی لیستێکی ئیشپێکردن

١. لە Media Player دا ماوسەکە لەسەر تابی Library بووەستێنە، پاشان کلیك لەسەر سەهمە سەربەرەوخوارەکە بکە. لە لیستەکەدا Create Playlist هەڵبژێرە.
٢. ناوێك بۆ لیستی ئیشپێکردنەکەت دابنێ، پاشان پەنجە بە کلیلی Enter دا بنێ.
٣. فایلێك لە ناو Library ەوە ڕابکێشە بۆ ناو لیستی ئیشپێکردنەکەت.
٤. بەردەوام بە لە زیاد کردنی فایل بۆ ناو لیستی ئیشپێکردنەکەت.
٥. فایلەکانی ناو لیستەکە شوێنگۆڕکێ پێبکە بەپێی ویستی خۆت بە ڕاکێشانیان بۆ سەرەوە یان خوارەوە.
٦. کلیك لەسەر Save Playlist بکە بۆ دروستکردنی لیستی ئیشپێکردنەکەت.









## دروستکردنی لیستێکی ئیشپێکردنی ئۆتۆماتیکی

١. ماوسەکە لەسەر Library بووەستێنە، پاشان کلیك لەسەر سەهمە سەربەرەوخوارەکە بکە، لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Create Auto Playlist بکە بۆ پیشاندانی دایەلۆگ بۆکسی New Auto Playlist.

٢. ناوێك بۆ لیستی ئیشپێکردنەکەت بنووسە.





٣. كلیك لێرە بكە بۆ دیاریكردنی ئەو یاسایەی كە ئەتەوێت بەكاربهێنرێت بۆ دروستكردنی یـــــی ئیشپێكردنەكە. (بۆ نموونە بەپێی ناوی هونەرمەند. یان جۆر هتد.).

٤. كلیك لەسەر هەریەك لە نووسینە هێڵبەژێرداهێنراوەكان بكە بۆ گۆڕینی یاساكەی

٥. كلیك لێرە بكە بۆ دانانی یاسای تر.

٦. كلیك لێرە بكە بۆ سنووردانان بۆ ئەو یاسایەی كە لە لیستەكەدا دات ناوە.

٧. ئەگەر شتێكت دانا و بەدڵت نەبوو، كلیكی لەسەر بكە و كلیك لەسەر دوگمەی Remove بكە بۆ لابردنی.

٨. كلیك لەسەر OK بكە بۆ دروستكردنی لیستەكەت.







## کۆپی کردنی مۆسیقای سەر CD

هەندێکی جۆری سیدی مۆسیقا یان گۆرانی هەن کە پێیان ئەوترێت سیدی "دەنگ" یان "صوت"، تۆ ناتوانیت ڕاستەوخۆ لە سیدییەکەوە گۆرانیەکانی ناویان کۆپی بکەیتە ناو کۆمپیوتەرەکەت، بەڵکو ئەبێت بەهۆی پرۆگرامێکی تایبەتییەوە ئەم کارە ئەنجام بدەیت، وە پرۆگرامی Media Player. لەجیاتی ئەوەی هەموو جارێك پێویست بکات کە سیدییەکە بخەیتە ناو کۆمپیوتەرەکەتەوە کاتێك ئەتەوێت گوێ لە مۆسیقایەك بگریت. ئەتوانیت مۆسیقاکە کۆپی بکەیت بۆ سەر هارد دیسکی کۆمپیوتەرەکەت، پاشان ئەتوانیت بەئارەزووی خۆت گوێ لەو پارچەیە بگریت کە ئەتەوێت. کاتێك مۆسیقا کۆپی ئەکەیت، ئەتوانیت چەند هەڵبژاردنێکی جۆری فایل و قەبارەکەی و ئاستی چاکیی دەنگی مۆسیقاکە دیاری بکەیت، ئەشتوانیت ڕێگە بە کۆمپیوتەرکەت بدەیت خۆی ئەمانە هەڵبژێرێت و تۆ خۆتی پێوە ماندوو نەکەیت.

### کۆپی کردن لە سیدییەوە

١. سیدی مۆسیقاکە بخەرە ناو درایڤی سیدییەکەوە. ئەگەر دایەلۆگ بۆکسی AutoPlay دەرکەوت. بەهۆیەوە ئیش بە مۆسیقاکە بکە لە ڕێگەی Media Player ەوە.

٢. کلیك لەسەر Rip بکە بۆ هەڵبژاردنی تابی Rip ئەگەر خۆی کلیکی لەسەر نەکراوە.

٣. ئیشارەت لە ئەو گۆرانیانە لادە کە ناتەوێت کۆپییان بکەیت.

٤. کلیك لەسەر Rip بکە بۆ پیشاندانی لیستەکە، لێرەدا ئەتوانیت گۆڕانکاری لە سیفاتی کۆپیکردنی مۆسیقاکەدا بکەیت.

٥. کلیك لەسەر Start Rip بکە، بووەستە تا گۆرانییە هەڵبژێرراوەکان کۆپی ئەبن.







### دروستکردنی سیدییەکی مۆسیقا

١. دڵنیابکەرەوە لەوەی کە سیدییەکی بەتاڵت لە درایڤی CD Writer ەکەتدا هەیە، پاشان کلیك لەسەر Burn بکە.

٢. Navigation pane بەکاربێنە بۆ دۆزینەوەی ئەو فایلانەی کە ئەتەوێت کۆپییان بکەیت، پاشان جۆری مۆسیقا و ئەلبوم و لیستی ئیشپێکردن ، یان ئەو گۆرانییەی کە ئەتەوێت هەڵ بژێرە.

٣. گۆرانییەکان ڕابکێشە بۆ ناو Burn List.

٤. تەماشای شوێنەکانی تر بکە بۆ دۆزینەوەی گۆرانی زیاتر، پاشان ڕایان بکێشە بۆ ناو Burn List.

٥. لەناوی Burn List دا گۆرانییەکان ڕابکێشە و شوێنیان بگۆڕە بەپێی ویستی خۆت.

٦. کلیك لەسەر Start Burn بکە، پاشان چاوەڕێکە تا گۆرانییەکان کۆپی ئەکرێن بۆ سەر سیدییەکەت.

## کۆنترۆڵ کردنی ئیشکردنی ڤیدیۆ

تەماشاکردنی ڤیدیۆ لە Media Player لە Windows دا کارێکی بێ پێچ و پەنایە. هەموو حەزی لەسەرتە ئەوەیە کە کلیک لەسەر لینکەکە بکەیت لە لاپەڕە ئینتەرنێتییەکەدا یاخود لە Library دا، بۆ تەماشاکردنی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەتوانیت کۆنترۆڵی خێرایی ئیشپێکردنەکە بکەیت و تەنانەت وێنە بە وێنە سەیری ڤیدیۆکە بکەیت.

### ← ڕێکخستنی ئیشپێکردنەکە

١. کاتێك ڤیدیۆکەت ئیش ئەکات، کلیك لەسەر سەهمەی سەربەرەوخواری تابی Now Playing بکە. ماوسەکە لەسەر Enhancements بووەستێنە، پاشان لە لیستەکەدا Video Settings هەڵبژێرە.
٢. سلایدەرەکان بەکاربێنە بۆ دەستکاریکردنی سیفاتی ڤیدیۆکە وەکو ڕەنگ و ڕووناکی و تاریکی هتد.
٣. کلیك لەسەر Select Video Zoom Settings بکە بۆ دیاریکردنی ڕووبەری ڤیدیۆکە.
٤. بەردەوام بە لە کلیك کردن لەسەر دوگمەی Next Enhancement و Previous Enhancement هەتا کۆنترۆڵەکانی Play Speed Settings دەرئەکەون.
٥. سلایدەرەکان ڕابکێشە بۆ دیاریکردنی خێرایی ئیشپێکردنەکە. ناوچە سەوزەکە ئەو خێراییانە پیشان ئەدات کە ئەتوانیت بەکاریان بێنیت.
٦. کلیك لەسەر دوگمەی Next Frame بکە بۆ وەستاندنی ڤیدیۆکە. پاشان کلیك لەسەر دوگمەی Previous Frame و Next Frame بکە بۆ جووڵان بەناو وێنەکاندا بۆ دواوە یان پێشەوە وێنە بە وێنە.
٧. کلیك لەسەر دوگمەی Next Enhancement یان Previous Enhancement بکە و کۆنترۆڵەکان بەکاربێنە بۆ ڕێکخستنی دەنگ.







## لێشکردن بە سیدییەکی مۆسیقا

لێشکردن بە سیدییەکی مۆسیقا هەر ئەوەیە کە سیدییەکە بخەیتە ناو درایڤی سیدییەکەوە و بووەستیت بۆ ئەوەی Windows Media Player دەستبکات بە لێشپێکردنی مۆسیقاکە. ئەشتوانیت خۆت سیدییەکە بخەیتە ئیش.

### ← لێشکردن بە سیدییەکی مۆسیقا

١. سیدییەك بخەرەوە ناو درایڤەکەوە، چاوەڕێکە تا Windows Media Player ئەکرێتەوە. ئەگەر دەستی پێ نەکرد، لە لیستی Start ەوە دەستی پێ بکە، پاشان لە تابی Library دا کلیك لەسەر CD بکە، پاشان دەبل کلیك لەسەر ئەلبومەکە بکە بۆ دەستپێکردنی.

٢. کلیك لەسەر تابی Now Playing بکە ئەگەر خۆی کلیکی لەسەر نەکراوە.

٣. ئەگەر ئەو زانیارییانەی کە ئەتەوێن پیشان نەدراون، کلیك لەسەر Now Playing بکە و لە لیستەکەدا یەکێك لەم شتانە بکە:

- بۆ بینینی زانیاری ئەلبومەکە ئەگەر خۆی پیشان نەدراوە کلیك لەسەر Show List Pane بکە.
- بۆ پیشاندانی ئامرازەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی دەنگ و لێشپێکردنەکە، ماوسەکە لە سەر Enhancements بووەستێنە و ئەو ئامرازە هەڵبژێرە.
- بۆ پیشاندانی وێنەی ئەلبوومەکە یان وێنەی جووڵاو لەگەڵ مۆسیقاکەدا، ماوسەکە لەسەر Visualizations بووەستێنە و شێوازێك هەڵبژێرە.

٤. ئامرازەکان بەکاربێنە بۆ ڕێکخستنی لێشپێکردنەکە. کلیك لەسەر دوگمەی Next Enhancement و Previous Enhancement بکە بۆ پیشاندانی ئامرازی تر.





## نیشکردن بە DVD

کاتێك فیلمێکی DVD بەهۆی Windows Media Player ەوە ئیش پێ ئەکەیت. ئەتوانیت بەپری شاشەکە سەیری بکەیت، ئەشتوانیت هەر لە ویندۆی Windows Media Player دا ئیشی پێ بکەیت.

### نیشکردن بە DVD

١. دیسکەکە بخەرە ناو درایڤەکەوە. ئەگەر ڕاستەوخۆ DVD ەکە دەستی بە ئیش نەکرد، لە لیستی Start ەوە Media Player بخەرەوە ئیش. پاشان لە تابی Library دا کلیك لەسەر DVD بکە، پاشان دەبڵ کلیك لەسەر دیسکەکە بکە بۆ دەستپێکردنی. ئەگەر ڤیدیۆکە پڕ بە شاشەکە نییە، Alt + Enter بکە.

٢. ماوسەکە بجووڵێنە بۆ پیشاندانی کۆنترۆڵەکان.

٣. کلیك لەسەر DVD بکە، پاشان بەویستی خۆت ئەم تایبەتمەندێتییانە بگۆڕە:

- Audio And Language Tracks (دەنگەکانی سەر دیڤیدییەکە، بە مۆسیقا و زمانەوە).
- Lyrics, Captions, And Subtitles (ووشەکانی گۆرانییەکە، یان نووسینی سەر شاشەکە و وەرگێڕانی قسەکان).
- Menus (لیستەکان)
- Camera Angles (گۆشەی کامێرا)

٤. کۆنترۆڵەکان بەکار بێنە بۆ وەستاندان، ڕۆشتن بۆ پێشەوە یان دواوە، یان گۆڕینی ئاستی دەنگەکە.

٥. سلایدەرەکە ڕابکێشە ئەگەر ئەتەوێت باز بدەیت بۆ شوێنێکی تر لە ڤیدیۆکەدا.

٦. ئەگەر ئەتەوێت کۆنترۆڵی زیاتر بەکاربێنیت، کلیك لەسەر Exit Full Screen Mode بکە، پاشان کۆنترۆڵە زیادەکانی ... Full mo... بەکاربێنە.





## گۆڕینی دیمەنی Media Player

Windows Media Player ئەتوانێت بە ژمارەیەك شێوە دەربکەوێت، تۆ ئەتوانیت بە Full mode نیشی پێ بکەیت بۆ ئەوەی هەموو کۆمپیوتەرەکە داگیر بکات، یاخود لە Mini Player mode دا نیشی پێ بکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت نیشی تر بکەیت لەگەڵیدا.

### ← گۆڕینی شێوازەکان

١. لە Windows Media Player دا ئەمانە بکە:

- Alt + Enter بکە بۆ گۆڕینی دیمەنەکە بۆ Full Screen.
- لە Full Screen دا پەنجە بە Esc دا بنێ یاخود کلیك لەسەر Exit Full Screen Mode بکە بۆ گەڕانەوە بۆ شێوازەکەی پێشوو.
- لە Full mode دا کلیك لەسەر دوگمەی View Full Screen بکە بۆ پڕکردنەوەی شاشەکە بە Media Player، یاخود کلیك لەسەر دوگمەی Switch To Compact Mode بکە بۆ ڕۆشتن بۆ Mini Player.
- لە Mini Player دا کلیك لەسەر دوگمەی View Full Screen Mode بکە بۆ ڕۆشتن بۆ Full Screen، یاخود کلیك لەسەر دوگمەی Return to Full Mode بکە بۆ ڕۆشتن بۆ Full mode.
- Ctrl + 2 بکە بۆ گۆڕینی دیمەنی پرۆگرامەکە.
- لە حاڵەتی Skins دا کلیك لەسەر دوگمەی Switch To Full Mode بکە.
- لە حاڵەتی Mini Player یان Skin دا، کلیك لەسەر دوگمەی Minimize بکە بۆ بچووك کردنەوەی پرۆگرامەکە بۆ سەر Taskbar. ئەگەر لەناو taskbar دا دەرنەکەوت، کلیکی ڕاستە لەسەر taskbar بکە، پاشان ماوسەکە لەسەر Toolbars بووەستێنە و کلیك لەسەر Windows Media Player بکە.






Full mode Compact Mode دوگمەی پیشاندانی Full Screen




Mini Player mode

دوگمەی گەڕانەوە بۆ Full Mode



Media Player toolbar




Skins mode





# بەكارهێنانی پەینت

ئامادەكردنی: إكرام هادی

ikramkurdi Gmail.com







## کردنەوەی پرۆگرامی پەینت

١. کلیك لەسەر دوگمەی Start بکە.





٢. کلیك لەسەر All Programs بکە.





٣. كلیك لەسەر Accessories بكە.

Home
Mozilla Firefox
Mozilla Thunderbi
Goals
Windows Media Pl
Internet Explorer
FLV Player
BitTorrent
Notepad
Adobe Reader
Encarta Dictionaries
Adobe Photoshop 7.
Download
Microsoft
UseNeXT
Yahoo! Messenger
Microsoft
Ares
MetaProducts Mass D
Microsoft Office Exce
WinRAR
Microsoft Office One
Windows Movie Make
Nokia PC Suite
Google Talk
All Programs
start

Windows Catalog
Windows Update
New Microsoft Office Document
Open Microsoft Office Document
Network Connections
Chikka Messenger v.4
New Office Document
Open Office Document
Yahoo! Messenger
Download Accelerator Plus (DAP)
Accessories
Games
Startup
Windows Media Center
WinRAR
Internet Explorer
MSN
Outlook Express
Remote Assistance
Windows Media Player
Windows Messenger
Windows Movie Maker
Yahoo! Messenger
C-Media 3D Audio
Microsoft Office
Nero
TuneUp Utilities 2007
TuneUp Utilities 2007
Mozilla Bon Echo
Mozilla Firefox
Adobe Reader 8
Advanced Task Manager

Game XP v1.4.1.17
Nokia PC Suite
Adobe ImageReady 7.0.1 ME
Adobe Photoshop 7.0.1 ME
Ares
Chikka Messenger v.4
QuickTime Alternative
Opera
NoClone 2007 Home
VP6 VFW Codec
Easy Duplicate Finder
MetaProducts Offline Explorer
Free Audio Network
DivX
IVT BlueSoleil
Learning Essentials
Microsoft Student
Ashampoo
ÞÇãæÓ ÕÎÑ ÇáÌíá
Your Uninstaller! 2006
IM2 v1.5.0.59
Serials 2005
Tradewinds 2
Tradewinds2
Ulead MediaStudio Pro 8.0
EverNote
MetaProducts Offline Explorer Pro
BitTorrent
Azureus Vuze
Kazaa Gold
LimeWire
Download Accelerator Plus (DAP)
Google Talk

3





٤. کلیك لەسەر Paint بکە.

Home
Mozilla Firefox
Mozilla Thunderbi
Goals
Windows Media Pl
Internet Explorer
FLV Player
BitTorrent
Notepad
Adobe Reader 8
Encarta Dictionaries
Adobe Photoshop 7.
Download Accelerat
Microsoft Office Wor
UseNeXT
Yahoo! Messenger
Microsoft Office Fror
Ares
MetaProducts Mass
Microsoft Office Exc
WinRAR
Microsoft Office One
Windows Movie Make
Nokia PC Suite
Google Talk
All Programs
start

Windows Catalog
Windows Update
New Microsoft Office Document
Open Microsoft Office Document
Network Connections
Chikka Messenger v.4
New Office Document
Open Office Document
Yahoo! Messenger
Download Accelerator Plus (DAP)
Accessories
Games
Startup
Windows Media Center
WinRAR
Internet Explorer
MSN
Outlook Express
Remote Assistance
Windows Media Player
Windows Messenger
Windows Movie Maker
Yahoo! Messenger
C-Media 3D Audio
Microsoft Office
Nero
TuneUp Utilities 2007
TuneUp Utilities 2007
Mozilla Bon Echo
Mozilla Firefox
Adobe Reader 8
Advanced Task Manager

Game XP v1.4.1.17
Nokia PC Suite
Adobe ImageReady 7.0.1 ME
Adobe Photoshop 7.0.1 ME
Ares
Chikka Messenger v.4
QuickTime Alternative
Opera
NoClone 2007 Home
VP6 VFW Codec
Accessibility
Communications
Entertainment
Media Center
System Tools
Address Book
Calculator
Command Prompt
Notepad
Paint
Program Compatibility Wizard
Synchronize
Tour Windows XP
Windows Explorer
WordPad
EverNote
MetaProducts Offline Explorer Pro
BitTorrent
Azureus Vuze
Kazaa Gold
LimeWire
Download Accelerator Plus (DAP)
Google Talk

4





## وێنەکێشان

Paint بۆ ئەوە دروست کراوە کە ڕێگەت پێ بدات وێنە دروست بکەیت و دەستکاری بکەیت. هەرچەندە ئەتوانیت وێنەکانت ئەتوانیت پرنت بکەیت، بەلاّم بەزۆری وێنەکانی ناو پرۆگرامی Paint بۆ ناو دۆکیومێنتەکانی تر بەکاردێن. ئەتوانیت لە Paint دا وێنەیەك دروست بکەیت و وەکو وێنەی سەر شاشەکە بەکاری بێنیت.



### وێنە کێشان

١. کلیك لەسەر دوگمەی Start بکە، بنووسە pain لە بۆکسی گەڕانەکەدا، پاشان کلیك لەسەر Paint بکە بۆ دەستپێکردنی پرۆگرامەکە.
٢. لە لیستی Image دا Attributes هەڵبژێرە بۆ کردنەوەی دایەلۆگ بۆکسی Attributes، پاشان بەرزی و پانی و سیفاتی تر بۆ وێنەکەت دیاری بکە. پاشان کلیك لەسەر OK بکە.
٣. کلیك لەسەر ئامرازێکی وێنەکێشان بکە.
٤. کلیك لەسەر هەڵبژاردنێك بکە بۆ ئامرازەکە. (تێبینی ئەوە بکە کە هەموو ئامرازەکان هەڵبژاردنیان نییە).
٥. کلیك لەسەر ئەو ڕەنگە بکە کە ئەتەوێت بەکاری بێنیت. دوگمەی چەپی ماوسەکە بەکاربێنە بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگی سەرەوە یان ڕەنگی سنوورەکە، دوگمەی ڕاستی ماوسەکەش بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگی پشتەوە یان ڕەنگەی پڕکردنەوە.
٦. کلیك بکە بۆ دەستکردن بە وێنە کێشان، یان کۆتایی یان سووچی شێوەکە ڕابکێشە بۆ دروست کردنی ئەو شێوەیەی کە ئەتەوێت. بەردەوام بکە لە تاقی کردنەوەی ئامرازەکان تا وێنەکەت تەواو ئەکەیت.





## ← بەکارهێنانی ئامرازەکان

١. شێوەکان ڕابکێشە بەهۆی پەنجە دانان لەسەر:

- دوگمەی چەپی ماوسەکە بۆ وێنەکێشان بە بەکارهێنانی ڕەنگی سەرەوە.
- دوگمەی ڕاستی ماوسەکە بۆ وێنەکێشان بە بەکارهێنانی ڕەنگی پشتەوە.
- کلیلی Shift بۆ گۆڕانکاری کردن لە شێوازی ئیشکردنی هەندێك لە ئامرازەکاندا، وەکو لە خشتەکەی خوارەوەدا دیارە.

ئامرازی هێڵ
ئامرازی چەندلا
ئامرازی نووسین
ئامرازی لاکێشە
ئامرازی پڕکردنەوە بە ڕەنگ
ئامرازی بازنەیی و هێلکەیی
ئامرازی لاکێشەی بازنەیی
ئامرازی فڵچەی هەوایی (سپرای)
ئامرازی فڵچە
ئامرازی قەڵەم
ئامرازی چەماوە





## کردنەوەی AVG

١. کلیکی ڕاست لەسەر ئایکۆنی AVG بکە لە سووچی ڕاستی خوارەوەی شاشەکەدا.





٢. کلیك لەسەر Launch AVG Control Center بکە.





## گەڕان بۆ ڤایرۆس

بۆ گەڕان بۆ ڤایرۆس لە فۆڵدەرێکی دیاریکراودا یان لە فلاشێکدا، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە:

١. کلیکی ڕاست لەسەر فۆڵدەرەکە بکە.

٢. کلیک لەسەر Scan with AVG بکە.





٢. AVG دەست دەکات بە گەڕان بەناو فۆڵدەرەکەدا.

٤. دوای تەواوبوونی ـ‌ڕانەكە، ئەگەر ڤایرۆس لە فۆڵدەرەكەدا نەدۆزرایەوە، ئەوا ویندۆكەی خوارە ـ پیشان دەدرێت.




٥. بەڵام ئەگەر ڤایرۆسی تێدا دۆزرایەوە، ئەوا ویندۆكەی خوارەوەت پیشان دەدرێت.







٦. كلیك لەسەر Display Result بكە.







٧ ویندۆكەی خوارەوەت پیشان دەدرێت. كلیك لەسەر Virus Results بكە.







٨. لێرەدا ئەو ڤایرۆسانەت پیشان دەدرێت کە دۆزراونەتەوە. کلیك لەسەر یەکێکیان بکە، یاخود هەموویان پێکەوە دیاری بکە بە ڕاکێشانی ماوسەکە بەسەریاندا.







٩. كلیك لەسەر Heal بكە بۆ چارەسەكردنی ڤایرۆسەكە.






١٠. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Close بکە.







## گەڕانی گشتی بە کۆمپیوتەرەکەتدا

لێرەدا باسی چۆنێتی ئەنجامدانی گەڕان دەکەین بە هەموو کۆمپیوتەرەکەتدا بۆ ڤایرۆس..

١. دوای کردنەوەی AVG، کلیك لەسەر Test Center بکە.





٢. ویندۆی Test Center دەکرێتەوە. بۆ گەڕان بە هەموو شوێنەکانی کۆمپیوتەرەکەتدا کلیك لەسەر Scan Computer بکە.





٣. ڕاستەوخۆ پرۆسەی گەڕانەکە دەست پێ دەکات.

AVG Free Edition - Test Center

Program Tests Results Service Information

AVG Anti-Virus Free Edition

Security status

The red highlighted components are in an error state! Please pay urgent attention to their configuration!

**Anti-Virus:** Internal Virus Database is out-of-date.

| File | Result/Infection | Path |
|---|---|---|

Control Center

Virus Vault

Help Topics

Scheduler

Test Results

***Attention:***

***You can also protect your data against spyware, hackers and spam!***

***Extend your protection level now...***

Scanned objects 568 Threats 0 Pause

**No threats found yet.** Stop

C:\Documents and Settings\Default User\Local Settings\...*.* 0 min 29 s

For Help press F1 7.5.484 269.11.17/951 8/13/2007 10:15 AM





## نوێکردنەوەی AVG

یەکێك لە گرنگترین بەشەکانی ئەنتی ڤایرۆس بریتییە لە تازەکردنەوەی پرۆگرامەکە لەڕێی ئینتەرنێتەوە. بە بەردەوامی ڤایرۆسی نوێ دروست دەبن، بۆ بەرگری کردن بەرامبەر بەم ڤایرۆسانە کۆمپانیای دروستکەری ئەنتی ڤایرۆسەکە چارەسەر بۆ ڤایرۆسەکە بڵاو دەکاتەوە، تۆش پێویستە ئەم چارەسەرە لە ڕێی ئینتەرنێتەوە دابەرینیت بۆ ئەوەی پارێزراو بیت لە ڤایرۆسەکە.

١. دوای کردنەوەی AVG، کلیك لەسەر Check for Updates بکە.



٢. کلیك لەسەر Internet بکە.




٣. ویندۆی AVG Update دەکرێتەوە. ئێستا پرۆگرامەکە پەیوەندی دەکات بە ئینتەرنێتەوە.







٤. باش ئەنجامدانی پەیوەندییەکە بە سەرکەوتوویی، ویندۆیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە کە چەند جۆرێکی نوێکردنەوەی تێدایە لە زۆر گرنگەوە بۆ کەم گرنگ. کلیک لەسەر یەکەم بکە کە لە هەموویان گرنگترە

٥. کلیك لەسەر Update بکە.




٦. پرۆسەی نوێکردنەوەکە دەست پێ دەکات. چاوەڕێ بکە هەتا تەواو دەبێت.






٧. دوای تەواوبوونی دابەزاندنی نوێکردنەوەکە، پرۆگرامەکە هەڵدەسێت بە دانانی فایلە نوێکان لەجێی فایلە کۆنەکان. بەمەش پرۆسەکە کۆتایی دێت.







شاردنەوەی فایل بە دوو هەنگاو دەکرێت. یەکەمیان بریتییە لە شاردنەوەی فایلەکە، دووەمیان بریتییە لە فەرمانکردن بە کۆمپیوتەرەکە کە فایلی شاراوە پیشان نەدات، یان پیشان بدات.

## یەکەم: شاردنەوەی فایل یان فۆڵدەر

١. کلیکی ڕاست لەسەر فایل یان فۆڵدەرەکە بکە.





٢. كليك لەسەر Properties بكە.







٢ دایەلۆگ بۆکسێکت بۆ دەکرێتەوە. ئیشارەت لە بۆکسی Hidden بدە.






٤. کلیك لەسەر OK بکە.







٥. دەبینیت کە ڕەنگی ئایکۆنی فایل یان فۆڵدەرەکە کاڵ دەبێتەوە یان هەر دیار نامێنێت، بە پشت بەستن بە ئەو فرمانەی کە بۆ کۆمپیوتەرەکەت دیاری کراوە (کە دواتر باسی دەکەین).





## دووەم: فەرمان كردن بە كۆمپیوتەركەت بۆ پیشاندان یان پیشان نەدانی فایل و فۆڵدەری شاراوە

دوای شاردنەوەی فایلێك، ئەگەر بتەوێت دووبارە پیشانی بدەیتەوە، پێویستە فەرمان بە كۆمپیوتەرەكەت بكەیت كە فایل و فۆڵدەرە شاراوەكان پیشان بدات. بە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:

١. كلیك لەسەر دوگمەی Start بكە.

٢. کلیك لەسەر Control Panel بکە.





٣. ئەگەر دیمەنی، ئەو ویندۆیەی کە کرایەوە وەك خوارەوە وابوو، کلیك لێرە بکە. ئەگەر وا نەبوو، ڕاستەوخۆ باز بدە بۆ هەنگاوی (٤).

Control Panel

File Edit View Favorites Tools Help

Back Search Folders

Address Control Panel Go

Control Panel

3 Switch to Classic View

See Also

Windows Update

Help and Support

Other Control Panel Options

Pick a category

Appearance and Themes

Printers and Other Hardware

Network and Internet Connections

User Accounts

Add or Remove Programs

Date, Time, Language, and Regional Options

Sounds, Speech, and Audio Devices

Accessibility Options

Performance and Maintenance

Security Center

My Computer





٤. دەبڵ کلیك لەسەر Folder Options بکە.





٥. كليك لەسەر تابی View بكە.







٦. بۆ پیشاندانی فایلە شاراوەکان، کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Show hidden files and folders بکە







٧. کلیك لەسەر OK بکە.



هەندێك جار لەکاتی کارکردن لەسەر کۆمپیوتەر، پرۆگرامێك لە کارکردن دەوەستێت، هەرچەندە کلیکی لەسەر بکەیت وەڵام ناداتەوە. هەر پرۆگرامێك لەم حاڵەتەدا بێت پێی دەوترێت unresponsive، واتە ناتوانێت وەڵام بداتەوە. ئەم حاڵەتەشە ئەکرێت بەهۆی زۆری ئەو پرۆگرامانە بن کە لە کۆمپیوتەرەکەتدا کراونەتەوە، یان بەهۆی ئەوەی کە پرۆگرامەکە خەریکی ئەنجامدانی کارێکە کە کۆمپیوتەرەکەت ناتوانێت بە باشی ئەنجامی بدات، یان کێشەیەك لە پرۆگرامەکەدا دروست بووە و لە شوێنێکدا وەستاوە و ناتوانێت لەوە زیاتر کار بکات. تۆ هەرچەندە بتەوێت بەرنامەکە دابخەیت، دەبینیت ناتوانیت کلیك لە هیچ شوێنێکدا بکەیت بۆ داخستنی پرۆگرامەکە، چارەسەری ئەم حاڵەتەش بریتییە لە داخستنی پرۆگرامەکە لە ناو لیستی پرۆگرامەکانی ویندۆزدا. لێرەدا باسی ڕێگایەکی خێرا و بەهێز دەکەین بۆ داخستن و ڕزگاربوون لەم پرۆگرامانە.

١. کلیکی ڕاست لەسەر کاتژمێری کۆمپیوتەرەکەت بکە.

EN
9:45 PM
Monday
1





٢. کلیك لەسەر Task Manager بکە. ئەتوانیت لەجیاتی هەنگاوەکانی (١) و (٢) سێ دوگمەی Alt+Ctrl+Delete پێکەوە بەکاربێنیت.





٣. پرۆگرامی Windows Task Manager (ویندۆز تاسك مانەجەر) ت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا لیستی ئەو پرۆگرامانەت پیشان دەدرێت کە لە کۆمپیوتەرەکەتدا کراونەتەوە. کلیکی ڕاست لەسەر ئەو پرۆگرامە بکە کە ئەتەوێت دایبخەیت. بۆ نموونە فۆتۆشۆپ.





٤. كلیك لەسەر Go To Process بكە.





٥. لێرەدا لیستێکی نوێت بۆ دەکرێتەوە لە هەموو پرۆگرامە کراوەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت. بە پرۆگرامی دیار و پرۆگرامە شاراوەکانەوە. ئەو پرۆگرامەی لە هەنگاوی (٣) دا هەڵت بژارد لێرەدا بەرەنگی شین دیاری کراوە. ئەوە بزانە کە ئەکرێت ناوی پرۆگرامەکانی ئەم لیستە جیاواز بێت لەگەڵ ناوە ئەسڵییەکەیاندا. بۆ نموونە ئەگەر بتەوێت پرۆگرامی Microsoft Word دابخەیتەوە، ئەوا لەم لیستەدا بە WINWORD.EXE دەردەکەوێت.

Windows Task Manager

File Options View Shut Down Help

Applications | Processes | Performance | Networking | Users

5

| Image Name | User Name | CPU | Mem Usage |
|---|---|---|---|
| searchprotocolho... | SYSTEM | 00 | 5,720 K |
| Photoshop.exe | X | 00 | 2,496 K |
| WINWORD.EXE | X | 00 | 1,652 K |
| firefox.exe | Ikram | 00 | 49,628 K |
| ctfmon.exe | X | 00 | 696 K |
| LastFM.exe | X | 00 | 16,496 K |
| searchfilterhost.exe | LOCAL SERVICE | 00 | 4,192 K |
| PDVDServ.exe | X | 00 | 948 K |
| winlogon.exe | SYSTEM | 00 | 1,524 K |
| bittorrent.exe | Ikram | 00 | 6,792 K |
| nvsvc32.exe | SYSTEM | 00 | 232 K |
| MDM.EXE | SYSTEM | 00 | 372 K |
| GoogleUpdaterSe... | SYSTEM | 00 | 68 K |
| explorer.exe | Ikram | 00 | 3,276 K |
| explorer.exe | X | 02 | 17,952 K |
| ONENOTE.EXE | X | 00 | 8,980 K |
| ctfmon.exe | Ikram | 00 | 296 K |
| alg.exe | LOCAL SERVICE | 00 | 152 K |
| svchost.exe | LOCAL SERVICE | 00 | 1,292 K |
| svchost.exe | NETWORK SERVICE | 00 | 1,140 K |
| svchost.exe | SYSTEM | 00 | 124 K |
| svchost.exe | SYSTEM | 00 | 3,996 K |
| svchost.exe | NETWORK SERVICE | 00 | 1,740 K |
| PDVDServ.exe | Ikram | 00 | 88 K |
| dna.exe | Ikram | 00 | 1,496 K |
| svchost.exe | SYSTEM | 00 | 1,464 K |
| csrss.exe | SYSTEM | 00 | 2,152 K |

☑ Show processes from all users

End Process

Processes: 44 | CPU Usage: 8% | Commit Charge: 628M / 1482M





٦. كلیك لەسەر End Process بكە.







٧. دایەلۆگ بۆکسێکی نوێت بۆ دەکرێتەوە. کلیك لەسەر Yes بکە. ڕاستەوخۆ پرۆگرامەکە دائەخرێت
پێویستە ئەوە بزانرێت کە داخستنی هەندێك لە پرۆگرامەکانی ئەم لیستە ئەکرێت کێشە لە کارکردنی
کۆمپیوتەرەکەتدا دروست بکات. لەبەر ئەوە تەنها شتێك دابخە کە ئەزانیت چییە. داخستنی هەندێکیان
ڕاستەوخۆ کۆمپیوتەرەکەت دەکوژێنێتەوە.





## کردنەوەی پرۆگرامی نیڕۆی ٧

ئەکرێت هەندێك لە هەنگاوەکان کەمێك جیاواز بن لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر.

١. کلیك لەسەر دوگمەی Start بکە.

٢. ماوسەکەت لەسەر All Programs بوەستێنە.





٣. ماوسەکەت لەسەر Nero 7 بووەستێنە.

٤. کلیك لەسەر Nero StartSmart بکە.





٥. نێرۆی ٧ دەكرێتەوە.







## کۆپی کردنی CD بۆ CD

١. ماوسەکەت لەسەر Data بوەستێنە.

٢. کلیك لەسەر Copy CD بکە.







٣. ویندۆی Nero Express دەکرێتەوە (دڵنیابکەرەوە لەوەی کە CD ی بەتاڵت خستووەتە ناو دەرایڤی CD Writer ەکەوە). کلیك لەسەر Copy بکە.

Nero Express
Select source and destination
Please select source and destination drives and insert source disc.
Source drive: G: HL-DT-ST DVD-ROM GDR8163B
Destination drive: H: HL-DT-ST CD-RW GCE-8527B [CD-R/RW]
Info
Caution: Some discs cannot be copied. They may be copy protected or contain errors.
If you are not sure if your disc can be copied, please run a trial in simulation mode (click on 'Advanced <<' and select Simulation).
Quick copy
Select this option to copy directly from the source to the destination drive. No space will be used on your hard drive.
Writing speed: 52x (7,800 KB/s)
Number of copies: 1
Verify data on disc after burning
Image file: C:\Documents and Settings\X\My Documents\Temp
Copy
3

٤. پرۆسەی کۆپی کردنەکە دەست پێ دەکات. چاوەڕێ بکە تا تەواو دەبێت.

Nero Express

Burning Process

Please wait...

| | Time | Event |
|---|---|---|
| | | Super Link activated |
| | 10:40:48 PM | Analyzing disc |
| | 10:40:48 PM | The CD is copyrighted |
| | 10:40:50 PM | Burn process started at 52x (7,800 KB/s) |

ULTRA BUFFER

Process status: Remaining time: 0:01:24 Total time: 0:01:23

19%

Writing at 52x (7,800 KB/s)

Stop





٥. ئەگەر یەکەمجارت بێت کە نێرۆ بەکاردێنیت لە کۆتایی کۆپیکردنەکەدا ئەم دایەلۆگ بۆکسەی خوارەوەت پیشان دەدرێت.




٦. ئیشارەت لەم بۆکسە بدە بۆ ئەوەی جارێکتر پیشانت نەدرێت. چونکە شتێکی بێ سوودە.




٧. کلیك لەسەر OK بکە.







٨. کلیك لەسەر OK بکە.





٩. کلیك لەسەر Next بکە.

Nero Express

Burning Process

Please wait...

| | Time | Event |
|---|---|---|
| | 10:40:48 PM | Analyzing disc |
| | 10:40:48 PM | The CD is copyrighted |
| | 10:40:50 PM | Burn process started at 52x (7,800 KB/s) |
| | 10:46:17 PM | Burn process completed successfully at 52x (7,800 KB/s) |

Burn process successful. You can print or save a detailed report.

Print

Save

Next

9





١٠. ئێستا هەر دوو CD ەکە دێنە دەرەوە و ویندۆکەی خوارەوەت پیشان دەدرێت. بۆ دروستکردنی کۆپییەکی تر لە هەمان CD ی پێشوو، کلیك لەسەر هەڵبژاردنی یەکەم بکە. یا خود ویندۆکە دابخەرەوە.





## گواستنەوەی فایل بۆ سەر CD

١. ماوسەکەت لەسەر Data بوەستێنە.

٢. کلیك لەسەر Make Data CD بکە.







٣. ویندۆی Nero Express دەکرێتەوە. کلیك لەسەر Add بکە.





٤. لێرەدا ئەو فایلانە بدۆزەرەوە کە ئەتەوێت بیانخەیتە ناو CD ەکەوە. بۆ نموونە کلیك لەسەر My Documents بکە.





٥. کلیك لەسەر فایل یان فۆڵدەرێك بکە.

٦. کلیك لەسەر Add بکە.





٧. دووبارە دەتوانیت کلیك لەسەر فایل یان فۆڵدەرێکی تر بکەیت و پاشان کلیك لەسەر Add بکەیت، هەموو ئەو فایل و فۆڵدەرانەت دیاریکردووە کە دەتەوێن.

٨. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Close بکە.

Add files and folders

File Browser | Desktop Search | Web Search | Saved Searches

Location: My Documents

Modules
Shortcuts
Desktop
My Documents
My Computer
My Network Places
Favorites

02
My Music
My Pictures
My Videos
OneNote Notebooks
Video Editor
Writing
500px-Qwerty_svg.png
amb_41.jpg
capture.gif
CyberLink PowerDVD
desktop.ini
f495-05.jpg
HBO4.jpg
Home's Documents
ikram.Theme
image.png
Last.fm
shortcut_arrow_logo.jpg
Side Notes.one
Thumbs.db
فایەرفۆکس ي دوو.doc

File name: HBO4.jpg
Files of type: All Files (*.*)
Add
Close

8





٩. کلیك لەسەر Next بکە.

Nero Express

Disc Content

Add data to your disc.

My Disc

| Name | Size | Type | Modified | Origin |
|---|---|---|---|---|
| My Pictures | 269 KB | File Fol... | 10/9/200... | C:\Documents and Setting... |
| amb_41.jpg | 14 KB | JPEG I... | 9/12/200... | C:\Documents and Setting... |
| HBO4.jpg | 81 KB | JPEG I... | 9/12/200... | C:\Documents and Setting... |

Add

Delete

Play

Total space used:

100MB 200MB 300MB 400MB 500MB 600MB 700MB 800MB

0 MB

Back

Next

9





١٠. كلیك لەسەر Burn بكە.

Nero Express
Final Burn Settings
Click 'Burn' to start the recording process.
Current recorder: H: HL-DT-ST CD-RW GCE-8527B [CD-R/RW]
Options...
Disc name: My Disc
Title (CD TEXT):
Artist (CD TEXT):
Language:
Number of copies: 1
Verify data on disc after burning
Allow files to be added later (multisession disc)
Back
Burn
10





١١. چاوەڕێ بکە تا پرۆسەکە تەواو دەبێت.

Nero Express

Burning Process

Please wait...

| | Time | Event |
|---|---|---|
| | | Super Link activated |
| | 11:47:14 PM | Caching of files started |
| | 11:47:14 PM | Caching of files completed |
| | 11:47:14 PM | Burn process started at 52x (7,800 KB/s) |

ULTRA BUFFER

Process status: Total time: 0:00:05

90%

Writing at 52x (7,800 KB/s)

Stop





١٢. لە کۆتاییدا دایەلۆگ بۆکسەکەی خوارەوەت پیشان دەدرێت. کلیک لەسەر OK بکە




١٣. کلیک لەسەر Next بکە.





١٤. كلیك لەسەر ئایكۆنی Close بكە بۆ داخستنی ویندۆكە.



